ئەمەش بووە هۆی لاوازی رۆژ بە رۆژی بزوتنەوەی ئیسلامی .. هەروەها بووە هۆی بە فیڕۆ چوونی ووزەو توانایەکی زۆر کە رابەرایەتی نەیتوانی لەخۆیان بگرێو بۆ ئامانجەکانی خۆیان بیانخاتە گەڕ .. نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو خاوەن ئەم ووزەو توانا پڕگەیشتوانە تێنیکی زۆری حاشیەو دارو دەستەکەی رابەریان کەوتە سەر .. ئەوانەی رێزیان بۆ هیچ پەیوەستێکی برایەتیو متمانەو سۆزی دینی دانەدەنا ..

٢ ـ نەبوونی هیچ جۆرە بەرنامە یان پرۆگرامێکی پەروەردەییانە بۆ یەکخستنی بیرو بۆچوونی ئەندامەکان چ لە رووی عەقیدەوە چ لە رووی فیکرییەوە .. ئەمەش وای کرد کە شێوازی جموجوڵو هەڵوێستی سیاسیو چالاکی سەربازیانە نەکرێن بە یەك .. بۆیە هەڵوێستو رای دژ بە هەڵوێستو رای رابەرایەتی دروست دەبوو چ لە لایەنی سیاسیدا چ لە لایەنی جەنگو ئاشتیدا ..

٣ ـ گرنگی نەدان بە مەرجی تەنزیمی (متمانەو لاوازی ـ التوثيق والتضعيف) لە بواری تەزکیەو وەرگرتنی خەڵکیدا لە ریزەکانی بزوتنەوە .. سەرکردایەتی بزوتنەوە رای خۆی کرد بووە (پسووڵەی لێبوردن) و بێ هیچ مەرجو پەرژینێك تەزکیەی خەڵکی دەکردو پاشان دەردەکەوت کە کابرا جێ متمانە نییەو پەریزی سیاسی پیسە .. تا لە پڕ ریزەکانی بزوتنەوە سمرانو درزیان تێ بوو .. بە تایبەتی نووسینگەی سەرکردایەتیو ئەنجومەنی شورا .. کاتێك بە خۆ زانرا کە ٩٠٪ نهێنییەکانی بزوتنەوەو کۆبوونەوەو چالاکییەکانی کەوتە دەست هەندێ لایەنی دژ بە ئیسلام ، یان ناحەز بە بزوتنەوە خۆی .. رۆژ بە رۆژیش سیخوڕو جاسوس زیاتر ، بوون .. تا هێندەیان لێ هات کە مەترسییەکی تەواو دروست بکەن بۆ تێکڕای دلسوزان ، بە تایبەتی لە تەوژمی لاوە تێگەیشتووەکان !!

٤ ـ لاوازی بەڕێوەبەرایەتی کاروباری دارایی :

دیاردەی هەرە زەقی لاوازی بەڕێوەبەرایەتی بەشی دارایی شاردنەوەی چەندو چۆنیەتی پارە هاتنو خەرج کردنی بوو .. تەنانەت تێکڕای ئەندامانی شورای باڵا کەسیان رۆژێ لە رۆژان ئاگاداری هیچ مەسەلەیەکی دارایی نەبوون . لە سەر ئەم نالەبارییەشەوە کۆمەڵێ مشەخۆرو گەنەی بەرژەوەند وویست لە دەوری رابەر

چەکەرەیان کرد بوو .. بە کەیفی خۆیان نە سەر پارەو ماڵی هەتیوو بێوەژنی هەناسە ساردی کورد دەلەوەڕانو کەس نەیدەزانی چۆنو بۆچی ئەو پارەو ماڵەی چاکە خوازان دەیننێرن بۆ بزوتنەوە ئاوا دەخرێتە خزمەتی هەواو هەوەسی تاقمێك زەروو ..

لەگەڵ دەرك کردنماندا بە دوایەکی ئەو سەلبیاتانەش هەر سوور بووین لە سەر سەرخستنی کاری جیهاد، بۆیە لە هەر پلەیەکی لێپرسراوێتیدا بوو بین بەردەوام راپۆرتو پێشنیارمان پێشکەش بە سەرکردایەتی دەکردو داوای رێکخستنی ریزەکانی بزوتنەوەو گەلاڵە کردنی ورزەو توانای لاوەکانمان دەکرد تا لە تەنزیمێکی بزوتنەوەییانەدا بخرێنە گەڕ کە هەڵقوڵاوی عەقیدەیەکی پاكو تێگەیشتنێکی راست بێت . تا هەموو هەڵوێستێکی عەقیدەییو سیاسیمانی - بەرامبەر دەوروپشتمان - لەسەر بنیات بنێین ..

ئێمە لە کاری خۆماندا بەردەوام بووین .. لەو لاشەوە بەردەوام گەنە مشەخۆرەکانی دەوروپشتی مامۆستا مەلا عثمان کەندو کۆسپێکی زۆریان دەخستنە سەر رێ .. تا دەهات کار ئاڵۆز تر دەبوو ..

تینو قورسایی‌یەکی ئابوری سەختمان کەوتە سەر، چ لە لایەن سەرکردایەتی بزوتنەوە خۆیەوە، چ لە لایەن ئەو کەسانەوە کە هەر لە دەرەوەو لە دوورەوە لایەنگری بزوتنەوەیان دەکرد (کە چەند عارەبێکی سامەڕائین) بە هیوای تۆڵە سەندنەوەیەکی عەشائری لە تکریتی‌یەکان .

ناکۆکیو جیاوازی کەوتە نێوان ئێمەو سەرکردایەتی بزوتنەوە .. تا وای لێ هات کە چارەسەر کردنی سەخت بوو، تەنانەت لە لایەن ئەو لایەنو دۆستە ئیسلامیانەشەوە کە هەوڵی چارەسەر کردنیاندا .. چونکە لایەنی مەلا عثمانو نوێنەرەکانی لە کەللەرەقی‌ولە خۆبایی بوون زیاتر هیچیان نەدەنواند ...

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا .. هەر دانمان بە خۆدا گرت ..

تا ئیتر تاوانێکی زۆر گەورەیان دەرحەقمان کرد .. بەوەی دایانینە دەست ئەمنو موخابەراتی دەوڵەتان !! دوای ئەوەی پارتە نیشتمانی‌یە کوردی‌یەکانیان لێ هاندابن بەو هیوایەی دوژمنداریمان بکەن ..

ئیتر کەلێنەکان گەورە تر بوون .. بەلام هێشتا . لەبەر خاتری پیرۆزی ناوی

ئیسلامو شەخسیەتی دینداران ، هەر خۆمان بە جوێ نەدەزانی . .

ساڵێکی تریش بەسەر دا ڕۆیشت . .

بەڵام دیمان سەرکردایەتی بزوتنەوە ، سیاسەتی دەرەوەی بزوتنەوەی گۆڕیو چارەنووسی بزوتنەوەی بۆ جاری دووەم بەستەوە بە ڕووداوی سیاسیو کارەساتی سەربازیانەی ناوچەکە . کە هەمیشە لە گۆڕاندایە . .

ئیتر بواری هاوکاری نەما . .

بە تایبەتی لە جاری یەکەمیدا کە چارەنووسی ناوچەکەی بەستبۆوە بە شەڕی نێوان عێراقو ئێران ئەو زیانە گەورەی لێکەوت کە لایەنەکانی تر بە خۆیان گەیاند . .

لە بەر ئەم هۆیانەو چەندەهای تر (کە نامانەوی لەم بارودۆخەی ئێستادا ئاشکرایان بکەین ) وە دوای لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیەکی تەواوی بارودۆخ بڕیارماندا کە لە (بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق ) جیا ببینەوە لە سەرکردایەتیو نووسینگەکانی . . لە بنکەو هێزەکانی . . لە ناوەوەو لە دەرەوە . . وە لە هەمان کاتیشدا بوونی خۆمان وەك کۆمەڵێکی ئیسلامی سەربەخۆ ڕادەگەێنین بە ناوی (کۆمەڵەی ئیسلامی کوردستانی عێراق ) کە لە هەموو بیرو بۆچوونێکی عەقائیدیو ئاراستە کردنی فیکریو ڕێبازی سیاسیدا سەربەخۆین . .

ئەوەش ڕادەگەێنین کە هەموو موسوڵمانێك لە نێو ڕیزەکانماندا بەرێزەوە وەردەگرین کە بە بەرنامەکەمان ڕازییەو دەیەوێ لەگەڵماندا بکەوێتە ڕێ . .

لە کۆتاییشدا داوا لە (بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق ) دەکەین کە بێنو هەرچی پەیوەندی بە کاروباری داراییەوە هەیەو لە نێوانماندایە یا یەکالای بکاتەوە . .

«ولنبلونکم حتی نعلم المجاهدین منکم والصابرین ونبلوا اخبارکم»

کۆمەڵەی ئیسلامی کوردستانی عێراق

١٨ ـ ی ڕەبیعی دووەمی ١٤١١ کۆچی

٥ ـ ی تشرینی دووەمی ـ ١٩٩٠ زاینی .

بەڵگەنامەی ژمارە (٦٧)

لۆگۆی کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق.

**الجماعة الإسلامية في كردستان العراق**

بەڵگەنامەی ژمارە (٦٨)

بەیاننامەی هێزی شەهید حەسەن بەننای بزووتنەوەی ئیسلامیی بەبۆنەی شەهید بوونی چەند پێشمەرگەیەکیانەوە (١٩٩٠/٧/٩).

بەنام

بسم الله الرحمن الرحيم

(إن الله يحب الذين يقاتلون في سبيله صفاً كأنهم بنيان مرصوص)

بەبۆنەی شەهید بوونی پێنج قارەمانی موجاهیدو خواویست پرسە لەهەموو برا موجاهیدو خواناسی و تێکۆشەرانی ئیسلام دەکەین . چونکە بەڕاستی ئۆرەسوارانی ئیسلام کە دەبنە قوربانی هەڵبژاردەی خوای گەورەن ، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت

( ويتخذ منكم شهداء )

ئەوەش ڕەجاو بکرێت ئێمە نابێت بەشەهید بوونو لەدەستدانی برایان بێ تاقەتو بێ وورە ببین چونکە وتەی بێ قوربانی و نووسینی بێ کردەوە وەکو لاشەی بێ گیانن تا گیان لەپێناویا دەبەخشرێ و ئەوساکە وتەو نووسین زیندو دەبێ و دەژی لە نێو زیندواندا .

ئاهەزارەهای وەک شەهیدانی گردی ڕەمکان و گوێزەو دۆڵەڕووت (و سەرگەت و جنار) ئەبنە سوتەمەنی و توێشوی حەبانی خوا ، تاخوێن ئەڕژێ خوا ئاوری سەرکەوتن لە بەندەی خۆی نادا تەوە تا تامەزرۆیانی شەهیدی لەهەموو بوارەکاندا باقی نەبنەوەو وەک ئاڵتوون لە ئاگر نەدرێن هەرگیز حوکمی خوا نایەتەبوون .

جا داوامان لەبرایان ئەوەیە کە

١- عەقیدەیەکی پاکی قورئانی و سوننەتی بکەنە مەشخەڵی هەنگاوی دەست پێ کردن
(وعد الله الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض كما استخلف الذين من قبلهم وليمكنن لهم دينهم الذي ارتضى لهم وليبدلنهم من بعد خوفهم أمنا يعبدونني لايشركون بي شيئا ومن كفر بعد ذلك فأولئك هم الفاسقون) النور ٥٥ .

٢- ڕیزەکانیان ڕێکخەن و ڕق و کینە نەمێنێت وەک پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەحەدیثێدا دەفەرموێت
(لا اختلاف بينهم ولاتباغض قلوبهم قلب واحد ) حديث صحيح بخاري .

٣- جیهادێکی ڕاستەقینە بکەن و مەبەستی کوردی و خۆپەرستی و عەصەبیات پەرستی بخەنە لاوە تا خوای گەورە سەرکەوتنیان پێ ببەخشێ
( وجاهدوا في الله حق جهاده) .

هێزی
شەهید حەسەن بەننا
٩/٧/١٩٩٠ دوشەممە

بەڵگەنامەی ژمارە (٦٩)

لۆگۆی چاپخانەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

چاپخانەی بێتوشی

چاپخانەی کۆچەران

چاپخانەی شەهیدان

بەڵگەنامەی ژمارە (٧٠)

پەیڕەوو پڕۆگرامی ناوخۆی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

پێشەکی/

بسم اللە الرحمن الرحيم

( وانزلنا اليک الکتاب بالحق مصدقا لما بين يديه من الکتاب ومهيمنا عليه فاحکم بينهم بما انزل اللّٰه ولاتتبع اهواءهم عما جاءک من الحق لکل جعلنا منکم شرعة ومنهاجا ... ) ٤٨/ المائدة.

نحمد اللّٰه الذي هدانا لهذا وما کنا لنهتدی لولا ان هدانا اللّٰه ونصلی ونسلم علی من جاء بالحق وصدق المرسلين ... سيدنا محمد خاتم الانبياء وقائد المجاهدين وعلی آلە الطاهرين واصحابه المتقين .. الانصار والمهاجرين ومن تبعهم باحسان الی يوم الدين .. وبعد :-

گومانی تێدا نیە کەوا کاتێ خوداوەند مرۆڤی بەدی هێنا و فێری دەربڕینی کرد .. بەرنامەیەکی بۆ دارشت کە لەسەری بڕوات لە ژیانی دا و بیکاتە ڕێگایەک بۆ سەرکەوتن و بەختەوەری لە هەردوو دنیا ، وە خوداوەند پێغەمبەرانی ناردن یەک لە دوای یەک و کتێبە پیرۆزەکانی بۆ ناردن



وەک روون کردنەوەیەک بۆ هەموو مەسەلەیەک وە ڕێنموونی و بەرەیی بۆ تەواوی جیهانیان هەتا ڕۆژی دوایی ، وە ڕاسپاردە ئاسمانیەکان کەپشتنە لووتکەی تەواوەتی بە دوایین پێغەمبەر محمد ﷺ وە ئەو قورئانە پیرۆزەی بۆ ناردە خواردوە کە گومانی تێدا نیە لەوەی ڕێنموونی تێدایە بۆ پارێزکاران ، وە هەر ئەویش ئەو یاسا بنچینەییە تەواوو فراوانەیە کە کاروباری دنیا و قیامەت مسۆگەر دەکات ، وە مرۆڤایەتی ڕێنوێنی دەکات لە هەموو رووو قۆناغێکدا ، هەرچەندە بارو دۆخیش بگۆڕێت وە گەشەو بەختەوەری و پیرۆزی بۆ جیهان بە دەست دێنێ .

وە پەروەردگار جیهادو شەرکردن و بەخت کردنی ماڵ و گیانی فەرز کرد بۆ بەرپا کردنی ئەو یاسایەو جێ بەجێ کردنی و بە کردەوە پیادە کردنی . وە پێغەمبەری مەزن ﷺ ویارانی بەڕێزی و پێشینانی چاکە خوار هەستان بە ئەرکی سەرشانیان بە سامان وگیان جیهادیان کرد هەتا سەربەرزی دنیا و سەرفرازی قیامەتیان بە دەست هێنا .

بەڵام کاتێ موسڵمانان ئەرکی سەرشانیان پشت گوێ خست و وازیان

لە جیهاد کردن هێنا ، خوداوەند
دوژمنانیانی بەسەردا زاڵ کردن و ئیتر
لە ناو ماڵی خۆیاندا پەلاماریان
دان و وڵاتەکەیان کردنە پارچە پارچەو
چەند دەوڵەتێکی گچکەلەیان لێ پێک
هێنا و نۆکەرانی خۆیان بەسەرەوەکردنە
دەستەڵاتداری مل کەچ لە بەرامبەر
کافراندا و توندوتیژ لەسەر برواداران و
خەلکەکەیان بەرەو دۆزەخ رێنموونی کرد،
ئیتر داگیرکەری کافری ستەم کار ئەو
کاربە دەستە ئالقە لە گوێیانەی کردە
چەپەڵ ترین ئامراز بۆ بەچۆکدا هێنانی
گەلان و تالان کردنی بەرو بووم وسامان و
فەوتاندنی رەوشت و شێواندنی بیرو
هۆش و لاوازکردنی خواست و توانایی و
لە دەست دانی پیاوەتی و ئازایەتی،
کە ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی کە وڵاتی
موسڵمانان بکەوێتە ژێر پۆستاڵی
داگیرکەران و موسڵمانانیش بکەونە ژێر
رکێفی زایۆنیزم و خاچ پەرستان و
مارکسیزمەوە،لە زۆربەی سەرزەمینی
ئیسلامی دا .

جا لە راستی دا ئەو فەرموودە
پیرۆزەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە دی
کە فەرموویەتی ( نزیک دەبێ کە
میللەتان پەلامارتان بدەن چۆن دەعبای

(٥)

گۆشت خۆرە پەلاماری نێچیری خۆی دەدات
یارانی فەرموویان : جا ئەوە لەبەر
کەمی ئێمەیە لەو کاتەدا ئەی پێغەمبەری
خودا ؟ فەرمووی نەخێر ئێوە زۆر دەبن
بەڵام هەر پووش و پەڵاش دەبن وەک
پووش و پەڵاشی سەر لافاو،وە خوداوەند
هیچ ترس و سامێکتان لە دڵی
دوژمنانتان دا ناهێڵێ و (وهن - لاوازی)
دەخاتە دڵتانەوە فەرموویان لاوازی چیە
ئەی پێغەمبەری خودا ؟ فەرمووی
خۆشەویستی دنیا و بێزاری لە مردنە ).

ئێمەش لە عیراقێک کە بۆتە لانەی
خاچ پەرستان و زایۆنیزم و مارکسیزم ..
کوفری ئاشکرا و بەدڕەوشتی و ستەمکاری
بەبێ پەردە دەبینین ، وە دەبینین کەوا
رەوشت پیسی تاوانبار هان دەدرێ و رێزی
لێ دەگیرێ بەڵام چارەسەر خوازی دەست
پاک هەڕەشەی لێ دەکرێ و خوێنی حەڵاڵ
دەکرێ و خەلکی وڵاتیش دەکوژرێن و
راو دەنرێن ، بەڵام کافری خۆشەپێنەر
رێزی لێ دەنرێت و ناوی بەنەمر یاد
دەکرێ ( وكان في المدينة تسعة رهط
يفسدون في الارض ولايصلحون ) ٤٨/ النمل.

وە دەستی وێرانکاری دەبینین کە
گوندو شار کاول دەکات و رووەک و مرۆڤ
بنەبڕ دەکات و شوێنەواری شارستانیەت و

(٦)

رواڵەتی ژیان دەسکار دەکات بە پــێی
نەخشەی کوفری جیهانی ئیتر زۆر بیرمــان
کردەوە و بۆمان دەرکەوت کەوا ڕێنوێنیو
ئامۆژگاری و وتاری سەرمینبەران و کـۆڕ
بەستن بە تەنیا ئەو بارودۆخەنالەبارو
زێڕ دەستی و زروفە سیاسی یە ناکـۆڕێ،
بەڵکو پێویستە لەسەرمان کەوا بەیـرەوی
لە ڕەوشت و مێژووی پیغەمبــــەران و
پیاو چاکان بکەین و بکەوینە شوێــــن
سوننەتی فەرماندەو گەورەمان محمد ﷺ
لە کۆچ کردن و جیهاد کردن و تــەواوی
ئاکاری .. هەتا ئەم سەرزەمینە پــاک
دەکەینەوەو ڕزگاری دەکەین لە زێرچەپۆکی
کوفری جیهانی و میللەتەکەی لە تاریکی
کوفرو ستەمکاری و ڕەوشت پیسی دەربـاز
دەکەین ، ئەمەش پیویستی بە نەخشــە
کێشانێکی دروست و بەرنامەرێژی یەکـی
ورد هەیە ، لەبەر ئەوە کۆمەڵێــــک
لە زانا جیهاد گێڕەکان و ڕۆشنبیــره
بەیام پەروەرەکان کۆ بوونەوە کــەوا
پەیمانیان بە خوداوەند داوەو لەگـەڵ
یەکتردا پەیمانیان بەستووە لەسەرجیهاد
کردن لە ڕێی خودا و بەرپاکردنــــی
دەوڵەتی قورئان ، بە پەیرەوی لــە
فەرموودەی پیرۆزی پەروەردگار ( ومالکم
لاتقاتلون فی سبیل الله والمستضعفین من

(٧)

الرّجال والنّساء والولدان الذیــــن
یقولون ربّنا اخرجنا من هذه القریـــة
الظّالم اهلها واجعل لنا من لدنک ولیّاً
واجعل لنا من لدنک نصیراً ) ٧٥/ النّساء
ئیتر بە یارمەتی یەزدان ئەو کۆمەڵە
ڕێککەوت لەسەر ئەو بەرنامەیەی کە لــە
شەری دەرۆین و ئەو یاسایەی کـــاری
پێ دەکەین ، کە لە قورئان و سوننەتــی
پیغەمبەرەوە ﷺ سەرچاوەیان گرتووە .

( ولینصرن الله من ینصـــــره
ان الله لقوی عزیـــــز )

(٨)

## بەشی یەکەم

### ناوی بزووتنەوەو دروشمی و ئامانجەکانی

بەندی یەکەم :-

أ- ناوی بزووتنەوە ( بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عیراق )ە .

ب- دروشمی بزووتنەوە ( قورئانێکی بڕۆز ، تفەنگێک ، خەنجەرێک ، ئالایەک کە ( لااله الاالله ) ی لەسەر نوسراوە .

### بیری بزووتنەوەو بەیرەوەکەی

بەندی دووەم :-

بزووتنەوەکەمان بزووتنەوەیەکی ئیسلامی بێ گەردە پەیرەوی لە بەرنامەی سەرفراوانی ئیسلام دەکات لە هەموو بوارەکانی ژیان دا ... لە بواری بیرو باوەرو کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و سەربازی و دادوەری و شارستانیەتیەوە .

(٩)

### ئامانج و مەبەستەکانی بزووتنەوە

بەندی سێیەم :-

أ- بانگ کردنی خەڵک بۆ خێرخوازی ، وە بڵاوکردنەوەی ئیسلام بە هەموو شێوازێکی شەرعی ڕەخساو .

ب- ڕێکخستنی ئەوانەی بەدەنگ بانگەوازەکەی خوداوە هاتوون لە ژێر ئالای ئیسلامدا .

ج- جیهادی کردەوەیی بۆ چەسپاندن و بەرپاکردنی حوکمی خوا لە سەرتاسەری وڵاتدا .

بەندی چوارەم :-

بزووتنەوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەم ڕێگایانەی خوارەوە دەگرێتە بەر :-

١- بەربەرەکانی کردن لەگەڵ ڕژێمی کافری خۆسەپێنەردا، هەتا بەرپاکردنی حوکمی ئیسلامی .

٢- لابردنی شوێنەوارەکانی ئەو ستەم و چەوسانەوەیەی کە گەلی کورد بە تایبەتی و گەلی عیراق بەگشتی گیرۆدەی بووە، ئەمەش بە پێی یاسای دادگەری خوایی کە ئەمیش لە شەریعەتی ئیسلامی خۆی دەنوێنێ .

(١٠)

## بەشی دووەم

سەرچاوەکانی بەرنامەی بزووتنەوە

بەندی پێنجەم :-

بەرنامەی بزووتنەوە لەم سەرچاوانەی خوارەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ :-

أ- قورئانی پیرۆز.

ب- سوننەتی پاکی پێغەمبەری خودا.

وە لە ڕێبازی جیهادیشمان دا سوود وەردەگرین لە :-

أ- تاقی کردنەوەی بزووتنەوە ئیسلامیەکانی جیهان.

ب- مێژووی ئیسلامی و ڕێ و شوێنی پیاوچاکان و سەرکردە موجاهیدەکان.

## بەشی سێیەم

هەڵوێستە سیاسیەکانی بزووتنەوە

بەندی شەشەم :-

أ- دەربارەی پەیوەندیمان بە ئوممەتی ئیسلامی ، بزووتنەوەکەمان ئوممەتی ئیسلامی بە ئوممەتێکی یەکپارچە دەزانێ کە لێک جیا ناکرێتەوە ، وە گەلی



کوردی موسڵمانیشمان بەشێکی هەرگیز جیانەبووەوەیە لەو ئوممەتە مەزنە .

ب- هەڵوێستمان بەرامبەر بزووتنەوەو ڕێکخراوو کۆمەڵ و دامو دەزگا ئیسلامیەکان پشتگیری و پشتیوانی کردنە بە تایبەتی جووڵانەوە جیهادیەکان لە ئەفغانستان و فەلەستین و لوبنان و ئەریتیریا و فلیپین و کشمیر ... بەو شێوەیەی کە ئامانج و ئاواتی موسڵمانان لە جیهان دا بەدی دێنێ لە ژێر سایەی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پاکی پێغەمبەری خودا ﷺ .

ج- هەڵوێستمان بەرامبەر دەوڵەتانی جیهانی ئیسلامی لە ژێر تیشکی هەڵوێستی ئەوان دەست نیشان دەکرێت بەرامبەر ئیسلامو ڕێکخراوە جیهادیەکان .

د- هەڵوێستمان بەرامبەر باقی دەوڵەتانی جیهان ، لە ژێر تیشکی هەڵوێستی ئەوان دەست نیشان دەکرێت بەرامبەر بە موسڵمانان .

هـ- هەڵوێستمان بەرامبەر شۆڕشی ئیسلامی ئێران هەڵوێستی پشتیوانی و پشتگیری یە ، لەسەر بنچینەی خزمەت کردن بە ئیسلام و موسڵمانان .

و- بەڵام هەڵوێستمان بەرامبەر ڕێکخراوە سیاسیەکانی تری عێراق

بریتی یە لە هەڵوێستی ڕێز لەیەکتر نان
وڕێکخستنی هەڵوێستمان بەو شێوەیەی کە
ڕۆوخاندنی ڕژێمی عیراق مسۆگەر دەکات ،
وە ئاواتی ڕەوای هەموو ڕۆڵەکانی
میللەت بەدی دێنێ .

ز- بزووتنەوە باوەری هەیە بە
ئازادی شوێن کەوتوانی ئاینە
ئاسمانیەکان لەبەر پاکردنی دروشمە
ئاینییەکانی خۆیان و ئەنجام دانی
کاروباری کۆمەلایەتی خۆیان بەو
شێوەیەی کە شەریعەتی داد پەروەری
ئیسلامی ڕێگەی داوە .

ح- بە هەموو توانایی یەکتەواوی
شێوەکانی داگیر کردن و چەوساندنەوەو
خۆسەپاندن و جیاوازیوڕەگەز پەرستی
لە جیهاندا ڕەتدەکەینەوە بە تایبەتی
خۆسەپاندنی زل هێزەکان بەسەر
میللەتانەوەو سووک کردنی خواست و
شکۆمەندێتییان .



بەشی چوارەم

چەمکە سیاسیەکانی بزووتنەوە

بەندی حەوتەم :-

أ- بزووتنەوە باوەری بە یاسای
ئیسلام و ئەو حوکمە هەیە کە لەسەر
بنچینەی ڕاوێژ ( الشوری )ە ، بە پێی
شەریعەتی ئیسلامی ، وە ئەو بنچینەیەش
لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی میللەت و لە
هەڵبژاردنی ئەمیر لەلایەن کۆڕی
ڕاویژەوە جێ بەجێ دەکرێت .

ب- بزووتنەوە هەموو شێوازەکانی
چوونە ژێر باری گوێ لە مستی
ڕەتدەکاتەوە لە پەیوەندی یە سیاسیو
نێو دەوڵەتییەکان دا .

ج- بزووتنەوە باوەری بە بەرپاکردنی
پەیوەندی سیاسی و نێو دەوڵەتییەکان
هەیە لەسەر بنچینەی ڕێز لەیەکتر
نان و بەرژەوەندی هاوبەش .

بەندی هەشتەم :-

أ- بزووتنەوە باوەری بە یەک
پارچەیی ڕۆڵەکانی ئوممەتی ئیسلامی
هەیەو هەوڵیشی بۆ دەدات ، چونکە ئەمە
بناغەی سەرکەوتنە لە سیاستانی

کۆمەلگایەکی سەربەخۆی گەشەداری بەختەوەردا .

ت – بزووتنەوە باوەڕی بە ئازادی کارو دەربڕینی را هەیە بەمەرجێک لەگەڵ بناغاکانی شەریعەتی ئیسلامیدا دژایەتی نەبێ .

## بەشی پێنجەم

## رۆشنبیری و پێشکەوتنی زانیاری

بەندی نۆیەم :-

أ – بزووتنەوە باوەڕی وایە کە داواکردنی زانیاری لە هەموو بوارەکاندا ، ئەرکی سەرشانی هەموو موسلمانێکە هەر بەمەش کۆمەلگایان دەکەوێتە سەر جەنی چاکی و ژیانیان بەرەو پێش دەچێت ، لەبەر ئەوە بزووتنەوە هەموو هەول و تەقەلایەکی دەخاتە کار بۆ خزمەتی زانیاری و زاناکان و پەرەپێدانی خوێندنە ئیسلامی و زانستی و ئەدەبی و هونەری و دادوەری بەکانەوە ، وە بایەخ دەدات بە کتێب دانان و وەرگێڕان و رۆژنامەگەری و راگەیاندن .

(١٥)

ب – بزووتنەوە هەوڵ دەدا بۆ پەرەپێدانی تیکنۆلۆژیای نوێ بە شێوەیەی کە خزمەت بە ئیسلام و کۆمەلگا بکات ، وە کەڵک لە هەموو تاقی کردنەوەیەک وەر دەگرێت کە خزمەت بە ئیسلام و سەربەخۆییمان بکات .

## بەشی شەشەم

## کاروباری کۆمەلایەتی

بەندی دەیەم :-

ا – بزووتنەوەکەمان بایەخ بەکاروباری کۆمەلایەتی دەدات وێرای بەجێهێنانی داد گەری کۆمەلایەتی ، ئەمەش بە پێی پەیرەوی شەریعەتی ئیسلامی بەم شێوەیەی خوارەوە :-

أ – خانە نشینی و دابین کردن ( التقاعد والضمان ) .

ب – سەرپەرشتی خێزان ، بە تایبەتی خێزانی شەهیدەکان .

ج – بایەخ دان بە مافی کرێکاران و دۆزینەوەی کار بۆ بێکاران .

٢ – بزووتنەوە هەوڵ دەدات بۆ

(١٦)

هێنانە دی سەرپەرشتی تەواو بـــو
ڕۆڵەکانی گەل لە بوارەکانی دایکێتی و
کۆرپەییدا ( الامومة والطفولـــة )و
سەرپەرشتی تەندروستی و سەرپەرشتـــی
پیرو پەککەوتەکان .

بەندی پانزدەهەم :-

بزووتنەوە بایەخ دەدات بە نیشتەجێ
کردن و ئاوەدان کردنەوەو پێشکەوتنـــی
هونەری بینا کاری ، وەلە بوارەکانـــی
ڕێ و بان و گواستنەوە ، بەو جۆرەی کە
لەگەڵ پێشکەوتنی هاوچەرخ دا دەگونجێ .

## بەشی حەوتـــەم

### بوارەکانی ئابـــووری

بەندی دوانزدەهەم :-

أ- بزووتنەوە هەموو ڕێگـــە
گونجاوەکان دەگرێتە بەر بـــۆ
چارەسەرکردنی کەرتە کشتوکاڵـــی و
پیشەسازی و بازرگانییەکان .
ب- بزووتنەوە هەوڵ دەدا بۆ لابردنی

(١٧)

هەموو ڕواڵەتەکانی چەوساندنـــەوەو
دەستەڵاتی سەپاندنی نارەوا .
ج- بزووتنەوە تەواوی ئەو ڕژێمـــە
ئابووری یانە ڕەت دەکاتەوە کە لەگـەڵ
یاسای شەریعەتی ئیسلامدا ناگونجێن .

بەندی سێنزدەهەم :-

بزووتنەوە هەموو هۆو کەرەستەیـــەک
بەکار دێنێ کە گەڕانەوەی دەربـــەدەر
کراو و ئاوارەکان مسۆگەر دەکات بـــۆ
ئەو شارو دێ یانـەیان کـــە
دەستەڵاتدارە تاوانکارەکان بە ستـــەم و
دەست درێژی لێیان وەدەر ناون ...
هەروەها بایەخ دەدات بە ئـاوەدان
کردنەوەی ئەو گوندو شارانە و قەرەبوو
کردنەوەی ئەو زیانە ئابووریانـــەی
لێیان کەوتووە .

(١٨)

بەشی هەشتەم

ڕێکخراو و نەقابەکان

بەندی چواردەهەم :-

بزووتنەوە گرنگی دەدات بە مافی ڕۆڵەکانی میللەت، بە تویێژە جۆراو جۆرەکانی یەوە لە پێکهێنانی ڕێکخراو و نەقابەکانی (کرێکاران، جوتیاران، قوتابیان، ئافرەتان وە پیشەیی یەکان).

بەندی پانزدەهەم :-

بزووتنەوەکەمان بایەخ دەدات بەمافی ئافرەت و بەشداربوونی لە بوارەکانی سیاسی و زانیاری و ئابووری بەو شێوەیەی کە لەگەڵ شکۆمەندی یە ئیسلامی یەکەی دا دەست دەدات.

بەشی نۆیەم

کاروباری سەربازی

بەندی شانزدەهەم :-

أ- بزووتنەوە هەموو ڕێگە ڕەواکان

(١٩)

دەگرێتە بەر بۆ بنیات نانی سوپایەکی ئیسلامی بەهێز، بە ڕووی خۆ سەپاندن و ستەم و ڕەوشت پیسی،وە بۆ ئەنجام دانی ئەرکی جیهادی ئیسلامی.

ب- بزووتنەوە کەڵک وەردەگرێ لە هەر تیکنۆلۆژیا و لێزانینێکی سەربازی کە بۆەبڕەخسێ بەو شێوەیەی کە لەگەڵ ئامانجە بەرزەکانی دا بگونجێ.

بەندی حەڤدەهەم :-

بزووتنەوە هەر پشتگیری و پارمەتی یەکی سەربازی وەردەگرێت کە وا لایەنە ئیسلامی یەکان پێشکەشی دەکەن بەمەرجی پاریزگاری لە سەربەخۆیی بزووتنەوەو فەرز نەکردنی بیرو را بەسەری دا.

(٢٠)

بەشی دەیەم

زمانی ڕەسمی بزووتنـــەوە

بەندی هەژدەهـــەم :-

أ- زمانی ڕەسمی بزووتنەوە زمانـــی کوردی یـــە .

ب- لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبـــی زمانی قورئان و سوننەتە ، بزووتنـــەوە بایەخ دەدات بە فێرکردن و خوێنـــدن و بڵاوکردنەوەی زمانی عەرەبی .

ج- بزووتنەوەکەمان بایەخ بە هەمـوو زمانە گرنگەکانی جیهان دەدات .

(٢١)

یاسای ناوخۆیـــــــی

بزووتنەوەی ئیسلامـــــــــی

لــــــە

کوردستانی عێـــــــــراق دا

بەشی یەکـــەم

پەیکەری ڕێکخستن و بەڕێوەبردنـــی بزووتنـــــەوە

بەندی یەکـــەم :-

أ- بزووتنەوە لەم بەشە سەرەکیانـــەی خوارەوە پێک دێت :-

١- ڕابەری گشتـــی ( المرشد العام ) :
بریتی یە لە ئەمیری بزووتنەوەلــــە کاروباری سیاسی و سەربازی و بەڕێـــوە-
-بردن دا .

٢- کۆڕی ڕاوێژ :
بریتی یە لە سەرکردایەتی بزووتنەوەو ڕەنگ ڕێژی سیاسەت و هەڵوێستەکانی .

٣- نووسینگەی سیاسی :
بریتی یە لە ڕاپەڕێنـــــــــەری

(٢٢)

سیاسەتەکانی بزووتنەوە لە هەموو لایەنێکەوە ، وە بەڕێوبەری چالاکی و جم و جوڵەکانی .

ب- سیفەتەکانی ڕابەری گشتی :-

( ئیسلامەتی ، پێکەیشتن ، زانست ، لە خوا ترسان (التقوی) ، بیر کاملی ، کاربەجێیی (الحکمة) ، ئازایەتی ، توانایی جێ بەجێ کردن ، هۆش ساغی ، جوامێری ، مەردایەتی و خۆگری ) .

ج- چۆنیەتی هەڵبژاردنی :-

هەڵبژاردنی ڕابەری گشتی لەلایەن ئەندامانی کۆڕی ڕاوێژەوە ئەنجام دەدرێت بە ڕێگەی دەنگ دانی نهێنی و مەرجی سەرکەوتنیشی بەدەست هێنانی دەنگی زۆربەی ئەندامانی کۆڕی ڕاوێژە .

وەلە حاڵەتی یەکسانی دەنگەکان لە نێوان پاڵێوراوەکاندا ، پرس پێکردنێکی گشتی لەنێو ئەندامانی بزووتنەوەدا ئەنجام دەدرێت .

ڕابەری گشتی لەسەرکار لادەبرێت ئەگەر مەرجەکانی ئەمیریتی پێشێل کرد ، یان لەبەرنامەو یاسای ناوخۆ لای داو لەسەر ئەوەش هەر سوور بوو ،



سەرەرای ئاگادارکردنەوەشی . لەلایەن کۆڕی ڕاوێژەوە ، وە بەرەزامەندی زۆربەی ئەندامانی کۆڕی ڕاوێژلادەبردرێت (بەلایەنی کەمەوە) .

د- دەسەڵاتی ڕابەری گشتی :-

١- ڕابەری گشتی مافی دەرکردنی فەرمان و ڕێنوێنی هەیە دەربارەی ئەوەی پەیوەندی بە کاری نووسینگەکانەوە هەیە ، بەو شێوەیەی پێچەوانەی بەرنامەو یاسای ناوخۆیی نەبێ .
٢- ڕابەری گشتی لێپرسراوی کۆڕی ڕاوێژی ناوەندی‌ونووسینگەی سیاسی یە .
٣- مۆرکردنی ئەو ڕێکەوتن نامەو پەیمان نامانەی کۆڕی ڕاوێژ بڕیاری لەسەر دەدات . وەلەکاتی بێ‌بڕیاری بوونی دا پێویستە زۆربەی ئەندامانی کۆڕی ڕاوێژبڕیاری لەسەر بدات بەلایەنی کەمەوە بۆ ئاچارکردنی ڕابەر بەو مەسەلەیە .
٤- بڕیاردان لەسەر بودجەی ساڵانەی بزووتنەوە دوای پەسەندکراتی لەلایەن کۆڕی ڕاوێژەوە .
٥- دەست نیشان کردنی کاتی کۆنفرانسەکان ، وە کاروباری گواستنەوەو دوورخستنەوەی لێپرسراوان لە

نووسینگەکان و هێزەکان لە حالەتی سەرپێچی کردنیان لە بەرنامەو یاسا ، یان بە پێی پێویستی بەرژەوەندی گشتی ، هەروەها قبول کردنی داوای وازهێنان ( الاستقالة ) لەسەر موافقەی کۆری ڕاویژ .

٦- ڕابەری گشتی مافی هەیە لیژنەکانی لیکۆلینەوە پێک بێنێ بۆچاو گێڕان بەگیرو گرفتەکانی ناو حزو دەرەوەی بزووتنەوەدا .

٧-

أ- بریارەکانی جەنگ و ئاشتی لە دوای پەسند کردنی کۆری ڕاوێژەوە ، لەلایەن ڕابەری گشتی یەوە مۆردەکرێت .

ب- ڕابەری گشتی بۆی هەیە داوابکات لە تەواوی ئەندامانی بزووتنەوە لەوانە ئەندامانی کۆری راوێژو لێپرسراوانی نووسینگەکان کە بچن بو جیهاد لە کاتی پێویستدا .

٨- ڕابەری گشتی مافیهەیە سێ یا ڕێدەدەر بۆ خۆی هەلبژیری بۆکاروباری سیاسی و سەربازی و بەڕیوە بردنلەریزی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ، وە بە ڕەزامەندیتی زۆربەی کۆری ڕاویژ .



بەندی دووەم :-

کۆری ڕاوێژی ناوەندی
( مجلس الشوری المرکزي )

ا- سیفەتی ئەندامانی کۆری ڕاوێژ :-

( ئیسلامەتی ، پێگەیشتوویی ( البلوغ ) ، بەردەوامی ( الاستقامە ) ، دەستپاکی ڕاستکۆیی ، ئازایەتی ، هۆش ساغی ، لێهاتوویی ، بیرکاملی ، ڕۆشنبیری گشتی ) .

ب- ژمارەی ئەندامانی (١٥) پانزدە ئەندام دەبێت ، وە دەکرێ ژمارەیان زیاد بکرێت بۆ (٢١) بیست و یەک ئەندام سەرەڕای چوار ئەندامی ئیحتیات .

ج- ئەندامانی کۆری ڕاوێژی ناوەندی لە کۆنفرانسی گشتی دا بە شێوەی ئازاد لە لایەن ئەندامانی بزووتنەوە هەلدەبژێردرێت بەپێی مەرج و شێوەکانی هەلبژاردن و بالاوتنیان لەلایەن ئەو لیژنەیەوە کە لەلایەن نووسینگەی سیاسی یەوە پێک دەهێنرێت .

د- دەستەلاتەکانی کۆری ڕاوێژ :-

ا- کۆری ڕاوێژ هەلدەستێ بەنووسین و ڕێکخستنی بەرنامەو یاسای ناوخۆی

بزووتنەوەو پێشکەش کردنی بە کۆنفرانسی گشتی بۆ پەسەند کردنی و ڕا لەسەر دانی.

٢- کۆری ڕاوێژ هەڵدەستێ بە پەسەندکردنی نەخشە سیاسی و سەربازیەکان، کەلەلایەن نووسینگەی سیاسی یەوە بۆی دەچێت دوای لێکۆڵینەوەی.

٣- کۆری ڕاوێژ هەڵدەستێ بە پەسەندکردنو ڕا لەسەر دان بۆ ئەندامانی نووسینگەی سیاسی دوای دەست نیشان کردنیان لەلایەن ڕابەری گشتی یەوە

٤- پێداچوونەوەو لێکۆڵینەوەی ڕێکەوتن نامەو پەیمان نامەکان و ڕەوانە کردنی بۆ بەردەم ڕابەری گشتی بۆ مۆرکردنی.

٥- بڕیاردان لەسەر پێداچوونەوەو لێکۆڵینەوەی بودجەی ساڵانەو ڕەوانەکردنی بۆ بەردەم ڕابەری گشتی بۆ پەسندکردنی.

٦- کۆری ڕاوێژ هەر یەک مانگ جارێک کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی دەبەستێ.. وە دەشێ لە حاڵەتی ناکاوی دا لەسەر داوای ڕابەری گشتی یان زۆربەی ئەندامانی کۆری ڕاوێژ کۆبێتەوە.

٧- لە کاتی وازهێنان یادەرکردنی یەکێک لە ئەندامانی کۆڕ یەکێک لە ئەندامانی ئیحتیات دەخرێتە شوێنی.

(٢٧)

٨- لە کاتی ئامادەنەبوونی ئەندامێک بەبێ بەهانەی ڕەوا ڕادانی لەکیس دەچێت، وە لەکاتێکدا ئامادەنەبوونی سێ جار لەسەر یەک دووبارە ببێتەوە، ڕابەری گشتی و کۆری ڕاوێژ بۆیان هەیە لێی بێ نیاز بن و ئەندامێکی ئیحتیات لە جێگەی دابنێن.

بەندی سێ یەم :-

نووسینگەی سیاسی

أ- نووسینگەی سیاسی لە (٧) حەوت ئەندام پێک دێت، یەکێک لەوانە ڕابەری گشتی یەو (٦) شەش ئەندامیش ڕابەری گشتی لە ڕیزی کۆری ڕاوێژ دەست نیشانیان دەکات لەوانەی کە خاوەن تاقی کردنەوەن لە بواری سیاسی و ڕێکخستن و سەربازی دا کۆری ڕاوێژ پەسەندیان دەکات.

ب- نووسینگەی سیاسی هەموو مانگێک دووجار کۆدەبێتەوە، جگە لە کۆبوونەوە لە ناکاوەکان لە کاتی نائاسایی دا.

ج - نووسینگەی سیاسی سەرپەرشتی هەموو ئەو نووسینگە ڕاپەڕاندنی یانەی

(٢٨)

خوارەوە دەکات .
١- نووسینگەی سەربازی .
٢- نووسینگەی دارایی .
٣- نووسینگەی راگەیاندن .
٤- نووسینگەی پەیوەندی .
٥- نووسینگەی ڕێکخستن .
٦- نووسینگەی داوەری .
٧- نووسینگەی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی.

بەندی چوارەم :-

نووسینگەی سەربازی

١- سەرپەرشتی هەموو کارو چالاکی بە سەربازیەکانی بزووتنەوە دەکات و بەکێک لە ئەندامانی کۆری راوێژی ناوەندی لێپرسراویەتی .
٢- ئەم نووسینگەیە لەم بەشانەی خوارەوە پێک دێت :-
أ- بەرێوەبەرایەتی
ب- مەشق کردن
ج- پرچەک کردن
د- چالاکی
هـ- پێداویستی جەنگی یەکان .

(٢٩)

٣- ئەو بەشانە هەڵدەستن بە دیاری کردنی ( تشکیل )ە سەربازیەکانی بزووتنەوەو پلان دانان بۆ چالاکیە جۆراو جۆرەکان بە رەزامەندی نووسینگەی سەربازی
٤- لێپرسراوی نووسینگەی سەربازی و ئەندامانی ئەو نووسینگەیە لە لایەن نووسینگەی سیاسی یەوە هەڵدەبژێردرێن .

بەندی پێنجەم :-

نووسینگەی دارایی

١- سەرپەرشتی کاروباری دارایی و داهاتی بزووتنەوە دەکات ، وەلیژنەیەکی (٥) پێنج نەفەری بەرێوەی دەبات ،یەکێک لە ئەندامانی راویژی ناوەندی سەرپەرشتی دەکات ، ئەندامانی لەلایەن نووسینگەی سیاسی یەوە هەڵدەبژێردرێن .
٢- ئەم نووسینگەیە لەم لقانەی خوارەوە پێک دێت :-
أ- بەرێوە بردن و ژاتیە .
ب- داهاتە داراییەکان و بەیتول مالْ .
ج- پارمەتی و سەرفکردن (ژمێرباری) .
د- بەشی راسپاردەو پارمەتیەکان .
٣- ئەو نووسینگەیە راپۆرتێکی مانگانە پێشکەش بە نووسینگەی سیاسی

(٣٠)

دەکات دەربارەی باروودۆخی دارایی بزووتنەوە .

٤- ئەو نووسینگەیە بودجەی ساڵانەی بزووتنەوە ڕێک دەخات و پێشکەشی دەکات بە نووسینگەی سیاسی و کۆڕی ڕاوێژ .

٥- چۆنیەتی دەستەڵاتی خەرج دەدرێتە نووسینگەی دارایی بۆ دانانی بەرنامەی خەرجی دارایی بۆ پێشکەش کردنی بە نووسینگەی سیاسی بۆ پەسندکردن .

بەندی شەشەم :-

لیژنەیەکی چاودێری دارایی پێک دێت لە سێ ئەندام لەلایەن نووسینگەی سیاسی یەوە بۆ چاودێری و لێکۆڵینەوەو پشکنینی داهات و سەرفیاتی دارایی، وە کلیلی یارمەتی یەکانی ناو خۆو دەرەوەی عێراقی بەدەستە . وە لە خۆگەی ئەوەوە هەموو یارمەتی و دیاری یەک دەڕژێتە نووسینگەی دارایی یەوە .

بەندی حەوتەم :-

سەرچاوەکانی دارایی و داهاتەکانی بەیتول مالی بزووتنەوە لەم سەرچاوانەی

(٣١)

خوارەوە پێک دێت :-

١- ئەو ئابوونەی کە ئەندام یان لایەنگر دەیدات بە بزووتنەوە .
٢- زەکاتی شەرعی .
٣- ئەو یارمەتی یەی کە خێر خوازان پێشکەشی دەکەن (بەبێ مەرج).
٤- دەسکەوتەکانی جیهاد .
٥- یارمەتی دەستەو بزووتنەوەو حیزب و ڕێکخراوە ئیسلامی یەکان .
٦- ئەو یارمەتی یانەی لەلایەن دەوڵەتە ئیسلامی یەکان و ڕێکخراوە جیهانیەکانەوە دەدرێت بەبێ مەرج وەها کە لەگەڵ پەیڕەوو مانجەکانی بزووتنەوەدا نەگونجێ .
٧- سامانی وەقف کراو .
٨- میراتی ئەوانەی بێ کەس و کارن .
٩- پرۆژە بەرهەم هێنەرەکان و قازانج بەخشەکانی بزووتنەوە .

بەندی هەشتەم :-

نووسینگەی ڕاگەیاندن

١- بە سەرپەرشتی هەموو کاروبارێکی ڕاگەیاندن و وریاکردنەوەی بزووتنەوە ڕادەکات .

(٣٢)

وه ئەو نووسینگەیە لەلایەن لیژنەیەکی (٥) پێنج کەسی یەوە بەڕێوە دەبرێ،کە یەکێک لە ئەندامانی کۆڕی راوێژ سەرپەرشتی دەکات ،وەئەندامانیشی لەلایەن کۆڕی راوێژەوە هەڵدەبژێردرێن ، بە هەڵبژاردنیان لەلایەن لێپرسراوەوە .

٢- نووسینگەش لەم لقانەی خوارەوە پێک دێت :-

أ- ئێرکە .
ب- رۆژنامەگەری .
ج- ئەرشیف و کتێبخانە .

بەندی نۆیەم :-

نووسینگەی پەیوەندی

ا- سەرپەرشتی پەیوەندیەکانی بزووتنەوە دەکات لەگەڵ لایەنە و دەستە جۆراوجۆرەکان دا ، وە ئەو نووسینگەیە لە لایەن لیژنەیەکەوە کە لە سێ کەس کەمتر نەبێت بەڕێوە دەبرێت کە یەکێک لە ئەندامانی کۆڕی راوێژ سەرپەرشتی دەکات ، لیپرسراو بە رادانی نووسینگەی سیاسی و ئەندامەکانیشی لە لایەن لیپرسراوەوە هەڵدەبژێردرین بە ئەری کردنی نووسینگەی سیاسی .



٢- ئەو نووسینگەیە لەم بەشانەی خوارەوە پێک دێت :-

ا- پەیوەندی ناوخۆ
ب- پەیوەندی دەرەوە
ج- بەڵگەنامەکان (الوثائق)

٣- ئەو نووسینگەیە هەڵدەستێ بە پەیوەندي کردن لەگەڵ هێزو دەستە جۆراو جۆرەکانی ناوچەیی و نێو دەوڵەتي یەکان بەپێی ئەو نەخشانەی نووسینگەی سیاسی دایان دەڕێژێت .

٤- هەڵدەستێ بەری خۆشکردن بۆ ڕێککەوتن نامەو پەیمان نامەکان وە پاراستنی بەڵگەنامەو نووسراوە تایبەتی یەکانی .

بەندی دەهەم :-

نووسینگەی خزمەتگوزاری کۆمەلایەتی

ا- سەرپەرشتی هەموو کاروبارێکی کۆمەلایەتی و تەندروستی بزووتنەوەو هێزەکانی دەکات ، وە لیژنەیەکی سێ کەسی بەڕێوەی دەبات کە لەلایەن

بەکێک لە ئەندامانی کـــــــۆڕی ڕاوێژ سەرپەرشتی دەکات

٢- نووسینگەکە لەم بەشانــــــەی خوارەوە پێکدێت :-

ا- پزیشکی بەتی ...

ب- نیشتەجێ کـــــردن وئاوەدان کردنەوە.

ج- چاودێری کۆمەلایەتـی.

د- شەهیـــــــدان.

بەندی پانزدەهـــەم :-

نووسینگەی ڕێکخســـتن

ا- کاروباری ڕێکخستن و پەروەردەی ئەندامانی سەر بە بزووتنەوەو تــەواوی شوێنەکانی جەماوەری موسڵمان بەڕێـوە دەبات، وە ژمارەی ئەندامانی پێنج کەسە، یەکێک لە ئەندامانی نووسینگەی سیاسی بەڕێوەی دەبات کە لە کاروباری ڕێکخستن وپەروەردەدا شارەزابێ.

٢- ئەو نووسینگەیە لەم بەشانــــەی خوارەوە پێکدێت :-

ا- بەشی پەروەردەو ڕێکخستن.

ب- بەشی زانیاری (معلومات).

ج- بەشی ڕێکخراووپەکیەتیەکان.



بەندی دووازدەهـــەم :-

نووسینگەی دادوەری

ا- ژمارەی ئەندامانی نووسینگەکـــە. پێنج کەسەو یەکێک لە ئەندامانی کــۆڕی ڕاوێژ سەرپەرشتی دەکات بە ڕەزامەندی ڕابەری گشتی.

٢- ئەم نووسینگەیە لەم بەشانـــــە پێکدێت :-

ا- بەشی وەرگرتنی سکالاو لێ کۆڵینەوە.

ب- بەشی داواچیەتی گشتی(الادعاء العام)

ج- بەشی فتواو حوکم دەرکردن.

٣- ئەم نووسینگەیە هەڵدەستێ بــــە ئامادەکردنی یاساکان بە پێی ئەوەی کە لە شەریعەتی ئیسلام و کتێبـــــــە فیقهی یەکان دا هاتووە.

## بەشی دووەم

## مەرجەکانی ئەندامێتـــــی

بەندی سیانزدەهـــەم :-

پێویستە لەسەر ئەو کەسەی دەیـــەوێ

سەر بە بزووتنەوە بێت ئەو مەرجانـەی تێدا بێت :-

١- دەبێ موسڵمان بێت ، زیر بێت ، پەیرەوی لە پایە (روکن)ە کانی ئیسلام بکات ، سوور بێ لەسەر بیروباو رەکەی .

٢- پابێ سەر بەدەسەبەک بێت کە پێچەوانـەی بەرنامەی ئیسلام و ئامانجەکانی بزووتنەوە بێت .

٣- دەبێ ناوبانگی چاک بێت و رەوشتی بەرزی ئیسلامی تێدا بێت .

٤- دەبی مەیل ( ولاء ) ی تەواوی بداتە بزووتنەوە وە بەیعەت بدات لەسەر گوێ رایەڵی تەواو بۆ رابەرایەتـ-ی بزووتنەوە و فەرماندەکەی لە هەموو بارودۆخێک دا ( مەگەر لە کاتی سەرپێچی کردنی لە فەرمانی خودا ) .

٥- هەرچەندە ئەو بزووتنەوەیە لە خاکی کوردستانەوە سەری هەڵداوە بەڵام دەرگای لەسەر پشتە بۆ هەموو موسڵمانان .

٦- هەروەک پیاو مافی هەیە سەر بە بزووتنەوە بێت ئافرەتیش ئەو مافەی هەیە ، جیا جۆری زمان و رەنگ و رەگەز کار ناکاتە سەر ئەندامێتی لە بزووتنەوەدا .

(٣٧)

بەندی چواردەهەم :-

بۆ وەرگرتنی ئەو کەسەی ئەو صیفەتانەی سەرەوەی تێدا بوو ، ئەو مەرجانەی خوارەوە بێوستە :-

١- دەبێ لانی کەم دوو کەس لە ئەندامانی بزووتنەوەوە بی ناسن وە مرۆڤی چاکی بزانن .

٢- دەبێ ماوەیەک لە تاقی کردنەوە ببریت کە لە (٦) شەش مانگ کەمتر نەبێت ، هەتا نووسینگەی سیاسی بڕیاری قبووڵ کردنی دەدات .

بەشی سێیەم

ڕاگرتنی ئەندامێتی - دەرکردن - سزاکان

بەندی پانزدەهەم :-

١- پێویستە لەسەر هەموو کەسانی بزووتنەوە بە پێشمەرگەو ئەندام و فەرماندەو سەرکردەوە کەوا پەیڕەوی تەواو بکەن لە بەرنامەی ئیسلام پشتە تێکرایی ، بەو شێوەیەی کە لە پەیڕەو پرۆگرامی ناوخۆدا هاتووە .

(٣٨)

٢ـ سزاکان دەکرێتە چەند بەشێکەوە :ـ
( ئیداری ( بەڕێوەبردن )و تەنزیمی ( ڕێکخستن ) و جینائی ( تاوانکاری)و سەربازی .
وە سزا ئیداری و تەنزیمی و سەربازیەکان بە ئیشی پەیکەری ئیداری و تەنزیمی بزووتنەوە دادەنرێت ، بەڵام سزا تاوانکاریەکان دەکەوێتە سووری دەسەڵاتی نووسینگەی دادوەری .
٣ـ سزا ئیداری و تەنزیمی و سەربازی یەکان :ـ
أـ ( التنبیه ) ئاگادارکردنەوەی .
(الأنذار ) ئاگادارکردنەوەی بە توندی.
(التوبیخ) سەرزەنشت کردن .
بـ ڕاگرتنی ئەندامیتی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو .
جـ چەککردنی .
دـ دابەزاندنی پلەی ئەندامیتی .
هـ ـ سزای دارایی .
وـ دەر(فصل)کردن لە بزووتنەوە .
زـ بەندکردن کە لەمانگێک تێنەپەڕێت ، وە لەکاتی پێویستی بەندکردنی بۆ ماوەیەکی درێژتر ، پێویستە نووسینگەی دادوەری بەمە ڕازی بێت .

(٣٩)

بەندی شانزدەهەم :ـ
فەرماندە مەیدانیەکان ولێپرسراوانی بزووتنەوە،کە لەلایەن نووسینگەی سیاسی یەوە ڕێگە دراون .. مافی دەرکردنی ئەو سزایانەیان هەیە جگە لە سزای فەصل کردن ، کە دەبێ بە فەرمانی نووسینگەی سیاسی بێت .

بەندی حەڤدەهەم :ـ
ئەو سەرپێچیانەی کە لەلایەن فەرماندە مەیدانی یەکان و لێپرسراو ئەندامانی نووسینگەکانەوە ئەنجام دەدرێت ، نووسینگەی سیاسی لێی دەکۆڵێتەوە .

بەندی هەشدەهەم :ـ
ئەو سەرپێچیانەی کە لەلایەن ئەندامانی نووسینگەی سیاسی یا ئەندامانی کۆری ڕاوێژەوە ئەنجام دەدرێت ، کۆری ڕاوێژ لێی دەکۆڵێتەوە بە ڕەزامەندی ڕابەری گشتی .

(٤٠)

بەشی چوارەم

پلەکانی ئەندامێتی لە بزووتنەوەدا

بەندی نۆزدەهەم :-

پلەکانی ئەندامێتی لە بزووتنەوەی ئیسلامی دا بەم شێوەیەی خوارەوەیە :-

١- لایەنگر : بریتی یە لەو کەسەی کە پەیوەندی بە بزووتنەوەوە کردوە، لە کاتی پەیوەندی کردنی‌یەوە هەتا نووسینگەی سیاسی بڕیار دەدات لەسەر وەرگرتنی ئەمەش بە پێی داواکاری و ناساندنی لە ڕێگەی نووسینگەی ڕێکخستنەوە .

٢- دامەزراو ( پالێوراو ) : بریتی‌یە لەو کەسەی نووسینگەی سیاسی بڕیاری وەرگرتنی داوە .. هەتا دەگاتە پلەی ئەندامێتی .

٣- ئەندام : بریتی‌یە لەو کەسەی لانی کەم سالێک لە پلەی دووەمدا مابێتەوە، وە لە لایەن نووسینگەی سیاسی یەوە گوێزرابێتەوە پلەی ئەندامێتی بە پێی متمانەی دوو ئەندامی پێشتری بزووتنەوە،

٤- نەقیب : بریتی لەو ئەندامەی لانی کەم دوو ساڵ لە پلەی ئەندامێتی دا مابێتەوەو گوێزرابێتەوە بۆ پلەی



چوارەم (نقیب) لە لایەن نووسینگەی سیاسی یەوە بە پێی متمانەی دوو نەقیبی تر .

ب- نووسینگەی سیاسی دەتوانێ پلەکانی ئەندامێتی شانازی ببەخشێ بە لێپرسراوان لە هەر ئاستێک بن .

بەندی بیستەم :-

پلەکانی ئەندامێتی لە بزووتنەوەی ئیسلامی بەم شێوەیەی خوارەوەیە :-

١- پشتیوان : بریتی لەو کەسەی پەیوەندی بە هێزی چەککداری بزووتنەوەوە کردووە هەتا نووسینگەی سیاسی بڕیاری وەرگرتنی دەدات تا گوێزانەوەی بۆ پلەی ئەندامێتی .

٢- پێشمەرگە : بریتی لەو کەسەی لە ریزەکانی سوپای بزووتنەوەدا وەرگیراوەو چەکی دراوەتێ .

٣- فەرماندەی کەرت : : فەرماندەی کۆمەڵێک پێشمەرگەیە کە ژمارەیان لە (١٥) پێشمەرگە کەمتر نی یە .

٤- فەرماندەی تیپ فەرماندەی چەند کەرتێکە ، لە نێوان (٣-٥) کەرتە .

٥- فەرماندەی مەڵبەند : بریتی یە لە فەرماندەی چەند تیپێک کە ژمارەیان لە (٣) تیپ کەمتر نی یە .
٦- لێپرساوی نووسینگەی سەربازی .

## بەشی پێنجەم

### باڵاوتن - هەڵبژاردن - کۆنفرانس

بەندی بیست و یەکەم :-

باڵاوتن ( الترشيح )

- هەموو ئەندامانی بزووتنەوە لە پلەی ئەندامەوە تا بەرەو سەرتر بۆیان هەیە بپاڵێورێن بۆ تەواوی پلە جۆراو جۆرەکان ، جگە لە ئەندامەتی کۆری راوێژو نووسینگەکان کە پێویستە لە پلەی نەقیبەوە بەرەو سەر بۆ ئەو پلانە بپاڵێورێن .

بەندی بیست و دووەم :-

دامەزراندنی فەرماندە سوپاییەکان لە پلەو پایە جۆراو جۆرەکاندا بە پێی پاڵاوتنێ دەبێت لە لایەن لێپرساوی



باڵاتر ەوە نووسینگەی سەربازی پەسندی دەکات .

بەندی بیست و سێ هەم :-

### هەڵبژاردن

هەڵبژاردنی کۆری راوێژ لەم حاڵەتانەدا ئەنجام دەدرێت :-

١- لە کۆنفرانسی گشتی بزووتنەوەدا کە سێ ساڵ جارێک دەبەسترێت (کۆنفرانسی ئاسایی ) .
٢- لە حاڵەتی وازهێنان یان دەر (فصل)کردنی یان مردنی نیوەی ئەندامانی کۆری راوێژ .
٣- لە حاڵەتی یەکدەنگی ئەندامانی نووسینگەی سیاسی یان دوو سێیەکی ئەندامانی کۆری راوێژ لەسەر پێداویستی بەجێهێنانی هەڵبژاردنی پێشوەخت ( کۆنفرانسی ناکاو ) .

بەندی بیست و چوارەم :-

هەموو کەسێک لە بزووتنەوەدا لە پلەی ئەندامەوە بەرەو سەر تر .
هەروەها هەموو کەسێک لە سوپای موجاهیدی بزووتنەوەدا لە پلەی

بێشمەرگەوە بەرەو سەرتر دەچێ بەشدار بکات لە کۆنفرانسی گشتی بزووتنەوەدا

بەندی بیست و پێنجەم :ـ

کۆنفرانسی گشتی بێ ساڵ جارێک وەک خولێکی ئاسایی دەبەسترێت لە پێشا و ئەم ئامانجانەدا :ـ

أ ـ بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆری راوێژی ناوەندی و دانانی نووسینگەی سیاسی و تەواوی نووسینگە رابەرینەرەکان.

ب ـ لێکۆڵینەوەی (ستراتیژیەتی) نەخشەو بەرنامەی بزووتنەوەی ئیسلامی لەسەر ئاستی ناوخۆیی و ئیسلامی و جیهانی .

ج ـ پەسند کردنی بەرنامەو باسای ناوخۆیی،کە لە لایەن کۆری راوێژی ناوەندی یەوە پێشکەش دەکرێت .

د ـ پرس و راوێژی گشتی و پەیمان و بەیعەتدان بە رابەری گشتی .

بەندی بیست وشەشەم :ـ

دەقی سوێندی فەرماندەبی و

(٤٥)

سەرکردەیی و ئەندامێتی :ـ

من ... کوری ... کە هەڵبژێردراوم یان دەست نیشان کراوم بە ... بەڵێن دەدەم و خودای پەروەردگاری جیهانیان دەکەمە شاهید،وە سوێند دەخۆم بە قورئانی پیرۆز کە فەرمانبەرداری و گوێ رایەڵی خوداو پێغەمبەر بخەمە پێش هەموو شتێکەوە لە ژیانمدا، وە خزمەت کردن بە بزووتنەوەی ئیسلامی و جیهاد لە ڕێگای خوادا بە ئەرکی سەر شانم بزانم لە ژیانمدا، وە نهێنی یەکانی بزووتنەوە بپارێزم، وە پەیرەوی لە بڕیارەکانی بکەم بە پێی بەرنامەو باسای ناوخۆیی ئەوەندەی لە توانایی دا بێت ، وە لە خودا دەپارێمەوە کە سەرکەوتووم بکات لەوەی بتوانم ئەو پەیمانە ببەمەسەر ... ئەو باشترین شاهیدە لەسەرئەم پەیمانەم .

بەندی بیست و شەشەم :ـ

ئەو بەرنامەو باسای ناوخۆییە کاری پێ دەکرێت دوای پەسند کرانی لە لایەن کۆری راوێژی ناوەندی یەوە .

(٤٦)

( وقل اعملوا فسيرى اللّه عملكم ورسوله والموءمنون ... ) .
(صدق اللّه العظيم)

وصلى اللّه على سيدنا محمد وآله الطاهرين وصحبه المجاهدين الابرار وآخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين .

ئەم بەرنامەو یاسای ناوخۆیی یە لە لایەن کۆری راویژی ناوەندی یەوە ئامادە کرا ، بەسەر پەرشتی رابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دا .

لە سەرەتای جمادی یەکەمی سالی ( ١٤٠٨ ) ی کۆچی . وە دوای پێداچوونەوەی لە لایەن ئەندامانی کۆری راویژەوە بۆ جاری دووەم پەسەند کرا لە سێ رۆژی دوای جەژنی قوربان ( أيام التشريق ) ی ١٤١٠ ی کۆچی .

چوار زانای بەشداربووی کۆنگرەی حزبی ئیسلامیی عێراقی ـ بەغداد ـ

ڕاوەستاوەکان لە ڕاستەوە/ م. عومەر عەبدولعەزیز، شێخ عوسمان عەبدولعەزیز

دانیشتووەکان لە ڕاستەوە/ م. سالّح عەبدولکەریم، شێخ جەمیل موفتی

بناری قەندیل ( ١٩٨٨/٨/١٢)

دەستەیەك پێشمەرگەی هێزی حەمزەو ئازادی بزووتنەوەی ئیسلامیی

بناری قەندیل ( ١٩٨٨/٨/١١)

دەستەیەك پێشمەرگەی هێزی حەمزەو ئازادی بزووتنەوەی ئیسلامیی

سنه (١٩٨٧)

له ڕاستەوە/ م. عەلی عەبدولعەزیز، مام جەلال، شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، شێخ عەبدوللەتیف بەرزنجی، شێخ موحەممەد بەرزنجی، عەبدوڕڕەحمان نەورەسی،...

هەندێ لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەدا

بناری قەندیل (١٩٨٧/١١/٢٥)

دەستەیەك پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامیی

گوێزێ (ئابی ١٩٨٧)

کۆمەڵێك سەرکردەی بزووتنەوەی ئیسلامیی و یەکێتیی نیشتمانیی دوای واژۆکردنی ڕێکەوتننامەی نێوانیان

سنە (١٩٨٩/٣/٢٦)

لە راستەوە (مەلا مەغدید، عەلی باپیر، شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، مەلا عەلی عەبدولعەزیز، مەلا شەریف)

سەردەشت (١٩٨٨/٩/١٧)

لە راستەوە: حەسەن بابەکر، بیلال بۆسکێنی، عەبدوڕڕەحمان نەورەسی، عەلی باپیر

شێخ عوسمان عەبدولعەزیز ڕابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق

بناری قەندیل (١٩٨٨)

دەستەیەك لە پێشمەرگەكانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە كاتی نان خواردندا

سنه (١٩٨٩)

شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، مەلا عەلی عەبدولعەزیز، شێخ تالیب، جەلال تاڵەبانی[١]

---

[١] وەرگیراوە لە: www.azmoon-kurd.com

سنه (١٩٨٩)

شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، جەلال تاڵەبانی[١]

سنه (١٩٨٩/٣/٢٦)

عەلی باپیر، شێخ عوسمان عەبدولعەزیز

[١] وەرگیراوە لە: www.azmoon-kurd.com

ئامادەیی ڕەوتی ئیسلامیی تایبەت نییە بە گۆڕەپانی
کوردستان، بەلکو ئەو دیاردەیە کۆمەلگە ئیسلامییەکانی
تێپەڕاندووەو تەواوی جیهانی گرتۆتەوە، لە سەرانسەری
جیهاندا دەیان زانکۆو پەیمانگاو دامەزراوەی ئەکادیمی
گرنگی تایبەت بەو دیاردەیە دەدەنو توێژینەوەی
لەبارەوە دەکەن، بەلام لە کوردستان تا ئێستا گرنگی
بەو دیاردەیە نەدراوە، دامەزراوەی ئەکادیمی تایبەت
بەو بوارە نەکراوەتەوە، توێژینەوەی بابەتیی‌و زانستیی
لەبارەوە ئەنجامنەدراوە، ئەمەش ئەوە دەخوازێت
ناوەندە زانستییەکان چیدی ئەو بوارە پشتگوێ
نەخەنو ئاوڕی لێبدەنەوە، ئەم توێژینەوە هەولێکە
لەو بوارەدا، تێیدا بە پشتبەستن بە دەیان بەلگەنامەو
سەرچاوەو دواندنی کەسایەتییە ئیسلامییەکان لە نزیکەوە،
باس لە قۆناغێکی هەستیاری مێژووی ڕەوتی ئیسلامیی
دەکاتو دەگونجێت بکرێتە سەرەتایەک بۆ ئاوڕدانەوە لەو بوارە.
Sherko
Khanzadi